# سەلام کردن

## زامنی پەیوەندییەکانە

ئامادەکردن و نووسینی
**هێمن فاروق**

چاپی یەکەم
٢٠١٤ز هەولێر ١٤٣٥ک

**ناسنامەی کتێب**

**ناوی پەرتوك: سەلام کردن زامنی پەیوەندیەکانە**

**بابەت: ئاینی**

**نوسینی: هێمن فاروق**

**چاپ: چاپی یەکەم (٢٠١٤)**

**چاپخانەی: رۆژهەلات**

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٨٢٧) ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە

# پێشەکی

بسم الله الحمد لله والصلاة والسلام على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم، أما بعد:

خودای گەورە هەر لەسەرەتای دروستکردنی مرۆڤەوە هەندێك تایبەتمەندی وەکو فیترەتێك پێبەخشیوە کە لە شانو شەوکەتو رێزی بوەشێتەوە، تا بەهۆیەوە لە بوونەوەرەکانی دیکە جیاواز بێ بەتایبەتی لەئاژەڵەکان، سەلام کردنیش یەکێکە لەمانە، جگە لەمە لە تایبەتمەندیەکانی ئیسلامیشە کە هانمان دەدات سەلام بلاو بکەینەوە چونکە هۆکارێکی گرنگە بۆ یەکرێزی موسڵمانان، هەروەها رێگایەکە بۆ بەهێزبوون و رەگ داکوتانی خۆشەویستی و برایەتی نێوان موسڵمانان، سەلام کردن ناونیشانی سەلامەتیو خورەوشت بەرزییە، کاریگەری دەروونی باشی دەبێ بۆ سەر دڵ و هەستی موسڵمان بەوەی ئارامی و ئاسودەیی باڵ دەکێشتە سەر دەروونی موسڵمان، رق و کینەو پەرتەوازەیی رادەماڵێ، لایەنە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانیش بەهێز دەکات، سەدان دڵیش بۆ خۆی رادەکێشێت، جگە لەم هۆکارانە خەڵکێکیش تا ئێستا نازانێت نەسەلام بکات، نە وەڵامی سەلام بداتەوە، بۆیە لەبەر ئەم هۆکارانە هەڵسام بەنووسینی پوختەیەك دەربارەی سەلام کردن، کە ئەم بەشانە لەخۆ دەگرێت:- سەرەتای سەلام لەکوێ هاتووە؟ مانای سەلام ، حوکمی سەلام، گەورەیی سەلام، ئادابی سەلام کردن، بەو ئومێدەم خودای گەورە لێم قبوڵ بکات، ئێوەی بەرێزیش سوودی لێوەرگرن.

# سەرەتای سەلام کردن

هەر لەوکاتەی خودای گەورە باوکە ئادەمی درووستکرد (علیە السلام) سەلام کردنی بۆ دانا وەکو لەم فەرمودەیە هاتووە ، قال رسول الله (ﷺ): (خَلَقَ اللهُ آدَمَ وَطُولُه ستُّونَ ذراعاً، ثُمَ قال: اذْهَبْ فَسَلِّمْ على أولئكَ مِنَ الملائكةِ فاستمعْ مَا يُحَيُّونَكَ، تَحِيَّتُكَ وتَحيَّةُ ذُرِّيتِكَ، فقالَ: السَّلام عليكم، فقالوا: السلامُ عليكَ ورحمةُ اللهِ، فزادُهُ: ورحمةُ اللهِ، فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الجنَّةَ على صورةِ آدمَ فَلَمْ يَزَلِ الخَلْقُ يَنْقُصُ حتى الآن) البخاري برقم (٣٣٢٦).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: کاتێ خودای گەورە ئادەمی دروستکرد شەست باڵ بەرز بووە، پاشان پێی فەرمووە: برۆ بۆلای ئەو کۆمەڵە فریشتەیە سەلامیان لێ بکە، گوێش ڕابگرە کە چۆن سەلامت لێ دەکەن، چونکە ئەوە سەلامی خۆت و نەوەت دەبێ، ئادەم (علیە السلام) گوتی: السلام علیکم، فریشتەکانیش گوتیان: السلام علیك ورحمة الله، وشەی (رحمة الله) یان بۆ زیاد کرد، جا هەر کەسێ کاتێك دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر شێوەی ئادەمە بەڵام لەو کاتەوە ئەو خەڵکە بەرە بەرە هەر بچووك و کورت دەبن هەتا ئەو ساتەش هەر لەکەمی و کورتی دەدەن.

# مانای سەلام

(السلام عليكم ورحمة الله وبركاتـه)

سەلام: لەخودی خۆیدا دوعایە بۆ بەرامبەرەکە، مانایەکی فراوانی جوانی هەیە : لەمانە:

أ) دووربن لە عەیب و کەم و کوڕی.

ب) دڵنیابن لەوەی کە تووشی شەڕو فیتنەو زەرەرتان ناکەم.

جـ) ئارامی و ئاسودەیی باڵ بکێشێتە سەر دڵ و دەروونتان.

د) لەهەموو کارەساتێك سەلامەت بن.

هـ) رەحمەتی خودا داتان بپۆشێ.

و) خودای گەورە رەحم بە حاڵتان بکات.

ی) بەرەکەتی خودا برژێ بەسەر ماڵ و منداڵ و بازرگانی و زانست و مامەڵەو بەرنامەکانتان...

## (السلام)

# ناوێکه له ناوه بەرزو پیرۆزەکانی خودای گەورە

(السلام) ناوێکی خودای گەورەیە مانا پوختەکەی: زاتی خودای گـەورە دوورە لەهـەموو کـەم و کـورتی و ناتەواویەکـەوە، سیفەتەکانیشـی سـەلامەتە لەهـەموو عـەیبێك، کردەوەکانیشـی سەلامەتە لە هەموو شەڕێکی ڕەهای بێ مەبەستی نا دادپەروەرانە، قال رسول الله (ﷺ): (إنَّ السلام اسمٌ مِنْ أسماءِ الله تعالى، وَضَعَهُ الله في الأرضِ، فَأَفْشُوا السـلامَ بيـنَكُم) البـزار في (مسـنده) بـرقم (١٧٧١)، البخاري في (الأدب المفرد) برقم (٩٨٩) وحَسَّنه الألباني.

واته: پێغەمبەری خودا (ﷺ)فەرمویەتی: بەڕاستی سەلام ناوێکە لە ناوەکانی خودای گەورە، خودای گەورە لەسـەر زەوی داینـاوە، دەسا ئێوەش سەلام لەنێو خۆتان بلآویکەنەوە.

پێغەمبـەر (ﷺ)فـەرمانمان پـێ دەکـات سـەلام بـلآو بکەینـەوە بەواتای: ببینه هۆکاری سەلامەتی و ئـارامی و هێمنـی بـۆ خـەڵك و ژینگەو دەوروبەر نەك ببینە مایەی ئاژاوەو تێکدان و وێران کردنـی نێوان خەڵك و ژینگەو دەوروبەر، کەوابوو: کاری موسڵمان ئاوەدان کردنەوەو پاراستنی ئـارامی و بلآوکردنـەوەی خۆشـی یـە نـەك بـە پێچەوانەوە.

# حوكمی سەلام كردن

قال تعالى: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴾ النساء: ٨٦ .

واته: خودای گەورە فەرمویەتی: كاتێ سەلامتان لێ بكرێ ئێوەش بەسەلامێكی جوانتر وەڵام بدەنەوە یان بەقەدەر سەلامەكەی ئەو وەڵام بدەنەوە بەڕاستی خودا بە حسابی هەموو شتێك دەگاو لەهەموو كەسێك دەپرسێتەوەو پاداشتی هەموو كارێكیش دەداتەوە.

لەبەر گەورەیی سەلام، خودای گەورە لەم ئایەتەدا بەڕوونی باسی كردووە بۆیە هەر لە ڕوانگەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە باس لە حوكمی سەلام دەكەم.

حوكمی سەلام كردن:- سەلام كردن سوننەتە، وەڵامدانەوەشی فەرزی عەینە، ئەگەر سەلامەكە لە تاكە كەسێك كرا ئەوا دەبێت كەسەكە وەڵامی سەلامەكە بداتەوە پاداشتیشی لەسەر وەڵامدانەوەكەی وەردەگرێ، بەڵام ئەگەر وەڵامی نەداوە ئەوا گوناهبار دەبێت.

ئەگەر سەلام لە كۆمەڵە كەسێك كرا، ئەوا وەڵامدانەوەی فەرزی (كیفایە)یە، واتە: ئەگەر كەسێك لەنێو كۆمەڵەكە وەڵامی دایەوە

ئەوا پاداشتەکەی بۆخۆی دەبات، واجبەکەی لەسەر ئەوانی تر هەڵدەگرێت، وەکو مردوو شوشتن، نوێژی مردوو....).

هیچ نەتەوەیەك یان زمانێك ناوچەیەك ناتوانێت ئەم سەلامکردنە بۆخۆی قۆرخ بکات و بیکاتە مولکی خۆی، بەڵکو ئەمە سەلامێکی ئیسلامیە نەك نەتەوەیی و ناوچەیی، بۆ هەموو بێ جیاوازی موسڵمانانە جا کورد بن یان عەرەب، یان تورك یان فارس یان.....).

سەلام کردن بەم وشە پڕ لەماناو پیرۆزو ناسکانە دەکرێ: لانی کەم: (السلام عليكم) سەلامەکە بە (تعریف) ناسراو بکرێ چاکترە واتە (ئەلف و لام) بە(السلام عليكم)ەکە لکا بێت، یان: (سلامٌ عليكم) سەلامەکە تەنوینی لەسەر بێ، هەروەها سەلام بە (نکیرە) نەناسراویش دەکرێ: (سلام عليكم) ، ئەگەر سەلامەکە لەیەك کەسیش بکرێ باشترە بە (جمع) (کۆ) سەلامەکە بکرێ: (السلام عليكم) چونکە جیهانێکی نادیار هەیە ئەوانیش بگرێتەوە چاکترە، خۆ ئەگەر بە (مفرد) تاك سەلامەکە بکرێ: (السلام عليك) ئەمەشیان باشە.

وەڵامدانەوەی سەلامیش پێویستە ئەگەر بە باشتریش وەڵام بدرێتەوە چاکترە وەکو لە مانای ئایەتەکەی پێشتر دەردەکەوێ،

نمونە: وەڵامی کەسێك کە سەلام دەکات دەڵێت: (السلام علیکم) ئەوا واجبە وەڵام بدرێتەوە : (وعلیکم السلام) وە باشترە لەدوای ئەمە بگوترێ (ورحمة الله وبرکاتە)، کەسێکیش کە سەلامەکەی بەم جۆرە دەکات: (السلام علیکم ورحمة الله) ئەوا واجبە وەکو خۆی وەڵام بدرێتەوە: (وعلیکم السلام ورحمة الله) ئەگەر (وبرکاتە) زیاد بکرێ باشترە، بەڵام ئەگەر بەم جۆرە وەڵامی بدرێتەوە: (وعلیکم السلام) ئەوا گوناهبارە، ئەو کەسەشی کە دەڵێت: (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە) ئەوا واجبە وەڵامەکەی وەکو خۆی بێت: (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاتە) لەمە زیاتریش نییە، ئەگەر بە کەمتر لەمە وەڵامی درایەوە ئەوا بەوەڵام دانانرێ. سەبارەت بە ئامرازی (واو) ئەگەر بە (علیکم السلام) بلکێنرێت باشترە (وعلیکم السلام)، ئەگەر تەنها بگوترێ (علیکم السلام) ئەمەشیان هەر دروستە.

بێگومان فەرمانی خودایە دەبێ وەڵامی سەلام بەجوانی بدرێتەوە، کەچی هەندێ کەس هەن زۆر بەبێ بایەخ و گوێ پێنەدانەوە وەڵامی سادەو هەڵە دەدەنەوە وەکو هەیە لە وەڵامی سەلامەکە دەڵێ: سەلام، سەلام سەرچاوم، ئەهلەن، بەخێربێی، مرحبا..... ئەم ووشانە بەر وەڵامی سەلام ناکەوێت، دەکرێ لەپاش

وەڵامدانەوەی سەلامەکە ئینجا چاك و چۆنی و ئەحوال پرسین و هاو شێوەی ئەمانە بەکار بێت.

## سەلام کردن هەق و مافی موسڵمانانە بەسەر یەکتریەوە

هەر کارو قسەو پرۆژەیەك ببێتە هۆکاری یەکڕیزی و تەبایی و لەیەك نزیك بوونەوەی موسڵمانان ئەوا ئیسلام بەگرنگ و پێویستی داناوە بۆ ئەوەی جێ بەجێ بکرێ، بێگومان سەلام کردن لەم بازنەیەیە، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)کردویەتیە ئەرك و ماف بەسەر یەکتریەوە، تا فەرامۆش نەکرێ، چونکە زامنی پاراستن و پەرەپێدانی یەکڕیزی موسڵمانانە.

قال رسول الله (ﷺ):(حقُّ المسلمِ على المسلمِ خَمْسٌ: ردُّ السلام، وعيادةُ المريضِ واتِّباعُ الجنائزِ، وإجابةُ الدَعوَةِ، وتشميتُ العاطِس) البخاري برقم (١٢٤٠)، مسلم برقم (٢١٦٢).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ)فەرمویەتی : مافی موسڵمان لەسەر موسڵمان پێنج شتە: وەڵامدانەوەی سەلام، سەردانی نەخۆش، شوێن کەوتنی تەرم، چوون بۆ نان خواردن (دعوەت)، دوعای خێر بۆ پژمیو.

# سەلام كردن یەكەم فەرمانی پێغەمبەر بووە (ﷺ) لە مەدینە

سەلام كردن ناونیشانی خورەوشت بەرزییە، بێگومان دینی ئیسلام دینێكی كۆمەلایەتیو بونیادنێنەری پەیوەندی خۆشەویستیە لەنێوان تاكەكاندا، سەیركە پێغەمبەر (ﷺ)پێش ئەوەی باسی نوێژو ڕۆژوو بكات باسی سەلام كردنی كردووە، وەكو عەبدوللای كوڕی سەلام (خودا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: كاتێ پێغەمبەر (ﷺ)هاتە شاری مەدینە یەكەم رستەی كە فەرموو ئەمە بوو: (يا أيها الناسُ، أفشوا السلامَ وأطْعِموا الطّعامَ ، وَصَلُّوا والناس نيامٌ، تدخلونَ الجنَّةَ بسلامٍ) الترمذي برقم (٢٤٨٥) وصححه الالباني.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ئەی خەڵكینە، سەلام بلاویكەنەوە نان و خواردن بدەنە خەڵك و (بەشەو) شەونوێژ بكەن كاتێ خەڵك لەخەودان ، ئەوا بەسەلامەتی و (بەبێ ئەزیەت و ماندو بوون‌و بە پێشوازی فریشتەكانەوە) دەچنە بەهەشت.

پێویستە لەسەر بانگخواز پڕۆژەی زیندوكردنەوەی سەلام كردن بخاتە پێشەوەی بەرنامەكانی و كاری بۆ بكات.

# سەلام كردن بەهەشت مسۆگەر دەكات

بەهۆی سەلام كردنی زۆر و بڵاوكردنەوەی دەگەیتە ئەو ڕۆژەی كە بەسەلام كردنیش پێشوازیت لێ بكرێ و بخرێیتە شوێنی سەلام، كە یەكێكە لە ناوەكانی بەهەشت، واتە: شوێنی ئاسایش و ئارامی و دوور لەدڵ توندی و ناڕەحەتی، خودای گەورە خەڵك بۆ ئەم شوێنە بانگ دەكات، قال تعالى: ﴿ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ ﴾ يونس: ٢٥.

واتە: خودای گەورە فەرمویەتی: خودای گەورە بانگی خەڵك دەكات بۆماڵی ئاشتی و ئاسایش دوور لە ناخۆشی (كە بەهەشتە). قال تعالى: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُم بِمَا صَبَرۡتُمۡۚ فَنِعۡمَ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴾ الرعد: ٢٤.

واتە: خودای گەورە فەرمویەتی: (فریشتەكان) پێیان دەڵێن: سەلامتان لێ بێ بەهۆی ئەوەی لە دونیا خۆتان ڕاگرتبوو لەسەر دینی خودا ئای كە ئارامگای دواییتان چەندە چاكو باشە. لەنێو بەهەشتیش تەنها هەر قسەی خۆش و سەلامەت دەگوترێو دەبیسترێ، قال تعالى: ﴿ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴾ الواقعة: ٢٦.

واته: خودای گەورە فەرمویەتی: تەنها هەر وتەی (سەلام..سەلام) دەبیسترێ. بەهەشتییەکان لەهەموو لایەکەوە سەلامیان لێ دەکرێ، کەش و هەوایەکی پڕ لە سەلامەتە بێگومان لە ڕێگای سەلام کردنەوە بەم ڕۆژە خۆشە دەگەین، عن أبي شُرَيحْ (رضي الله عنه) أنه قال:(يا رسول الله! أخْبِرْني بِشَيءٍ يوجِبُ لِيَ الجَنَةَ؟ قالَ: طِيبُ الكلامِ، وَبذلُ السلام، وإطعامُ الطعام) الطبراني في (الكبير) برقم (٤٦٩)، ابن حبان في (صحيحه) برقم (٥٠٤) قال شعيب الارنؤوط: اسناده جيد.

واته: لەئەبو شورەیحەوە (خودا لێی ڕازی بێ) گوتی : ئەی پێغەمبەری خودا! شتێکم پێ بڵێ بەهەشتم بۆ مسۆگەر بکات، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: گفت و قسەی نەرم و شیرین، سەلام کردن، نانداني خەڵك. ژیان ئەو کات تام و چێژی هەیە کە متمانەیی و دڵنیایی و سەلام لەنێو کۆمەڵگەکەدا بلاّوبێتەوە.

## مسۆگەر کردنی کۆشکی بەرز لەبەهەشت

سەلامکردن موسڵمان بەماڵی سەلام رادەسپێرێنت لە نێوشیدا دەیخاتە نێو جوانترین و خۆشترین و سەرنجڕاکێشترین و بەرزترین خانوو، کە لەدنیا خەونی پێوە دەبینی وەکو پێغەمبەر (ﷺ)

لەوەسف کردنی  فەرمویەتی:(إنَّ في الجنَّةِ غُرفاً يُرَى ظاهِرُها مِنْ باطِنها وباطِنُها من ظاهِرِها أعَدَّها اللهُ لِمَنْ أطْعَمَ الطَّعَامَ و أفشى السلام وصلى بالليلِ والناس نيام) ابن حبان في (صحيحه) برقم (٥٠٩) وقال شعيب الارنؤوط: اسناده قوي.

واتە: بەراستی لەبەهەشتا کوشكو تەلاری وای تیایە کە لە ژوورەوەی دەرەوەی  لێ دەبینرێو لە دەرەوەی ژوورەوەی  لێ دەبینرێ (شەفافە)، خودای گەورە بۆ ئەو کەسەی ئامادەی کردووە کە خواردن  بەخەڵك دەداتو سەلام بڵاو دەکاتەوەو بەشەو شەونوێژ دەکات، کاتێك خەڵك لەخەودان.

## سەلام کردن باوەڕ کامل دەکات

باوەڕی موسڵمان شتێکە هەردەم کاری بۆ دەکەین تا جوانتر و کامل تری بکەین، سەلام کردن لەو کارانەیە کە باوەڕ تەواو دەکات.

قال رسول الله (ﷺ):(لا تَدخلُونَ الجَنَةَ حَتَىَ تُؤمنوا وَلا تُؤمِنوا حتَّى تحابُّوا ، أولا أدُلُّكُم على شَيءٍ إذا فَعَلتمُوه تَحابَبتُم؟ أفشوا السلامَ بينكم) مسلم برقم (٥٤).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ)فەرمویەتی: کەستان ناچنە بەهەشت هەتا باوەڕ نەهێنن ، وە باوەڕیشتان تەواو نابێت هەتا یەکتریتان

خـۆش نـەوێت، ئایـا شـتێکتان پیشـان نـەدەم ئەگـەر کردنـان یەکتریتان خۆش بوێت؟ سەلام لەنێوخۆتان بلاو بکەنەوە.

مانای بەردەوام دەم بە سەلام بـن و زۆر سـەلام لەیـەك بکـەن، لـە کتابی (صحیح البخاری) هاتووە بە ژمارە (٢٠) لـە عـەممار (خـودا لێـی ڕازی بێـت) ریوایـەت کـراوە فەرمویـەتی:

(ثلاثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَد جَمَعَ الإيمان: الانصافُ من نَفْسِكَ ، وبِذْلُ السلامِ للعالمِ، والإنْفاقُ من الإقْتَار).

واتە: سێ سیفەت هەن هەر کەسێ لەخۆیدا کۆی بکاتـەوە ئـەوا بەڕاستی ئیمـانی کۆکردۆتـەوە: زەمـیرو ویـژدان هـەبوون، سـەلام کردن لەهەموو خەڵك، بەخشین لەکاتی گرانی و نەبونیدا.

باوەڕت ئەو کاتە تەواو دەبێت کە هـیچ هۆکـارێکی دونیـایی و خـۆ بەگەورە زانینێك نەبێتە ڕێگر لەوەی سەلام لەخەڵك نەکەی.

## سەلام کردن سەدەقەیە

بازنـەی سـەدەقە کـردن تـەنها پـارەو پـول و خـواردن و بەخشینەوە ناگرێتەوە بەڵکو لەوە فراوانترە ، لەمانە سەلام کردن، ئەمە یەکێکە لەنهێنیەکانی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) کـە (١٤٣٥) سـاڵ بـەر لەئێسـتا سـەلام کـردنو ڕوویـەکی خۆشـی بەبەخشـین

داناوه. باس لە قسەی خۆش‌و رووخۆشی دەكات كە (سەلام كردن) دەگرێتەوە، وەسفیان دەكات بەبەخشین وەكو پارەو پول‌و خەڵات، زانستی سەردەم بەتاقیكردنەوە لەسەر مێشكی مرۆڤ سەلماندویەتی كە چۆن خەڵات‌و بەخشینەوە كاریگەری بەسوودی دەبێ لەسەر خانەیەك لەمێشك بەهەمان شێوە قسەیەكی خۆش‌و روویەكی خۆشیش ئەم خانەیە چالاك دەكات‌و خۆشی دەخاتە نێو دڵ.

قالَ رسـول الله (ﷺ): (مِنَ الصدقةِ أن تُسَلِّمَ على الناسِ وأنتَ طليقُ الوَجْهِ) ابن أبي الدنيا في كتابه (اصطناع المعروف) برقم (٢٦) وقال الالباني في كتاب (الترغيب والترهيب): صحيح لغيره برقم (٣٨٩٨).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: لەسەدەقەكردن ئەوەیە كە بەڕوویەكی خۆشەوە سەلام لەخەڵك بكەیت. سەلام كردنێك گەر بە ڕووێكی گرژو مۆن و بەلالوتەوە بێت ئەمە دژ بە مانای خودی سەلامەكەیە كە ئامانج لێی خۆشەویستی و لێك نزیك بونەوەیە، بەڕاستی موسڵمانی وا هەیە وا دەزانێ دینداری یەكسانە بە توندو تیژی و گرژی و پێنەكەنین، وا حاڵی بووە كە بەدەرخستنی ددانەكانی مانای دەرخستنی عەورەتە، كە ئەمەش دوورە لە پەروەردەو ڕێبازی پێغەمبەری دەم بە زەردەخەنە(ﷺ).

# سەلام کردن سەلامەتت دەکات

سـەلام کـردن ناونیشـانی سـەلامەتی‌و دڵنیـایی‌و چارەسـەری نەخۆشییە دەروونیەکانە بەوەی خاوەنەکەی دەپارێزێت لـەدوورە پـەرێزی‌و پچـڕاندنی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی، هـەروەها نامـەی خۆشەویسـتییە بـەوەی بـەردەوامی دەدات بەخۆشەویسـتی‌و راکێشانی دڵ‌و ریشەکێش کردنی رق‌و کینەو دووبەرەکی بۆیـە زۆر جـار سـەلام کردنەکـەت بـۆت دەبێتـە پـەرژینێك کـە خـەڵکێك لەخۆراییەوە بەرگریت لێ بکەن، هەروەها دەبێتە هۆکارێکیش بـۆ ئەوەی پـارێزراو بیـت لـە شـەڕو فیتنـەی خـەڵکی خـراپ ، ئەگـەر کەسی خـراپ جارێـك بیـەوێت زیانـت لێبـدات بـەڵام چونکە ڕێـزت گرتووە کاتێك بەلای دا تێپەڕیوی سەلامت لێی کردووە ، لەوانەیـە دڵی بۆت نەرم بێت ، دەستی نەچێت زیانـت پـێ بگەیـەنێت یـان شەڕت پێ بفرۆشێت.

**قـالَ رسـول الله (ﷺ): (أفشـوا السـلامَ تَسْـلَموا) ابـن حبـان في (صحيحه) برقم (٤٩١)، البخاري في (الأدب المفرد) بـرقم (٧٨٧) وصححه الألباني.**

**واتـە: پێغەمبـەر (ﷺ)فەرمویـەتی: سـەلام بـڵاو بکەنـەوە ئێـوە سەلامەت دەبن.**

## سەلام كردن پلیەت بەرز دەكات

سەلام كردن ناونیشانی سەركەوتنە چونكە زامنی یەك دەنگیو یەكریزیە كە ئەم دووانە هۆكاری سەركەوتنو زاڵ بوونە بەسەر شەیتانو نفس دوژمنانی دین، جگە لەمە هەموو كەسێك خوازیارە لەلای خودای گەورەو لە نێو كۆمەڵگاكەیدا رێزو پایەكی بڵندی هەبێت، جا بۆ بەدەستهێنانی ئەم پلەیە پێویستە بەردەوام دەمت بەسەلام كردن بێ، لێی بێزار نەبێت، قال رسول الله (ﷺ): (أفشوا السلامَ كَيْ تعلوا) صحيح الترغيب والترهيب برقم (٣٩١٧). واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: سەلام زۆر لە یەكتری بكەن تاوەكو بەرزو بڵند بن.

## سەلام كردن و وەڵامدانەوەی رێگایەكی ئاسانە بۆ خێر كۆكردنەوە

بێگومان لە رۆژی دواییدا بەتایبەتیش لە كاتی تەرازوو كەس بەكەڵكی كەس نایێت تەنها چاكەكان نەبێت، جا بۆ ئەو رۆژە چارەنوسسازە پێویستیمان زۆر بە زادو زەخیرە هەیە ، سەلام كردنیش لەم زادو زەخیرانەیە كە لە دونیادا بە ئاسانیو بەبێ

ماندوو بوون کۆدەکرێتەوە، عن عمران بن حُصَیْن (رضي الله عنه) قال: جاءَ رجلٌ إلى النبيِّ (ﷺ) فقالَ : السلامُ عليكم، فَرَدَّ عَليهِ، ثُمَ جلَسَ، فَقَال النبي (ﷺ): (عَشرٌ)، ثُمَ جاءَ آخرٌ، فقالَ: السلام عليكم ورحمة الله، فَرَّدَ عَليه، فَجَلَسَ، فَقالَ : (عِشرونَ)، ثُمَ جاءَ آخَرُ، فقال: السلام عليكم ورحمةُ الله وبركاتهُ، فَرَّدَ عليه، فَجَلَسَ، فَقالَ: (ثلاثون). أبو داود برقم (٥١٩٥) الترمذي برقم (٢٦٨٩) وصححه الألباني.

واتە: عمرانی کوڕی حوسەین (خودا لێی ڕازی بێت) گوتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)گوتی: السلام عليكم، پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامەکەی دایەوە، پاشان پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (دە) خێری بۆ نووسرا، دواتر یەکێکی تر هات و گوتی: السلام عليكم ورحمة الله، پێغەمبەر (ﷺ) وەڵامی دایەوە، کابراکە دانیشت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (بیست) خێری بۆ نووسرا، پاشان کەسێکی تر هات و گوتی: السلام عليكم ورحمة الله وبركاته، سەلامەکەی وەڵامداوە، جا کەسەکە دانیشت ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (سی) خێری بۆ نووسرا.

# ئەو کەسەی سەلام ناکات ڕەزیلە

ڕەزیلی سیفەتێکی ناشیرین و قێزەوەنە تەنها لە پارەو پولدا نیە، بەڵکو هەیە ڕەزیلی لە لێخۆش بوون دەکات، هەیە ڕەزیلی لە کەل و پەلەکانی دەکات... بەڵام لەهەمویان ڕەزیلتر ئەوەیە کە ڕەزیلی لە سەلام کردن بکرێ، قال رسول الله (ﷺ): (....وأبخَلُ الناسِ مَنْ بَخِلَ بالسَلامِ) الطبراني في (الاوسط) برقم (٥٥٩١) والبيهقي في (شعب) برقم (٨٣٩٢)، صحيح جامع الصغير برقم (١٠٤٤).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: ڕەزیلترینی خەڵك ئەو کەسەیە کە ڕەزیلی بە سەلامکردن دەکات. جا بۆ ئەوەی نەچیتە نێو بازنەی ڕەزیلان، ئەوا ڕەزیلی بەم چەند وشە جوان و شیرینە مەکە کە لەسوودو قازانج زیاتر هیچی ترت دەست ناکەوێ.

## حەسودی بردنی جولەکە بە سەلام کردن

حەسـودی واتـا هیـوا خواسـتنە بـەوەی ئـەو نیعمەتـەی لـەلای بەرامبەرەکەیـەتی نـەمێنێت و لەدەسـتی بـدات و خـۆی ببێتـە خاوەنی. حەسودی نەخۆشیەکی کوشندەیە یەکەمجار خاوەنەکەی دەسوتێنێت بەوەی توشـی دەردی دەکات دواتـر گـەر بـۆی ڕێـك بکەوێت هەوڵ دەدات زیـان بـە بەرامبەرکـەی بگەیـەنێت، جولەکـە کـاتێ بینیـان و زانیـان سـەلام کـردن هۆکـاری یـەکرێزی و خۆشەویستی و لێك نزیك بونـەوەی موسـڵمانانە هـەروەها فـەزڵ و بەرەکەتی زۆرە، بۆیە بەحەسـرەت بـوون ئەمـە لـەنێو موسـڵمانان نەمێنێت و کۆچ بکات، قال رسول الله (ﷺ): (ما حَسَدَتْكُمْ اليهودُ على شيءٍ ما حَسَدَتْكُمْ على السَّلامِ والتَّأْمين) ابن ماجه برقم (٨٥٦) وصححه الالباني.

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویـەتی: جولەکـە حەسـودیان بەهیچ شـتێکتان نابـات ئەوەنـدەی حەسـودیان بەسـەلام و ئـامین کردنتان دەبات.

کـەوابوو: جولەکـە بـەردەوام و بـێ حەسـانەوە بەهـەموو ڕێگاکانیانـەوە هەوڵیانـداوەو دەدەن ئـەم سـەلام کردنـە لـەنێو موسڵمانان نەهێلن، یان کاڵی بکەنەوە، یان لەنێو کۆمەڵگە نـامۆی

بکەن ، یان شەرم بکرێ ئەم سەلامە بکرێ، یان بە چاك و چۆنیەوە بگۆڕدرێتەوە بەبیانوی ئەوەی ئەم سەلامە عەرەبیە، یان..........، جا لەبەرامبەر ئەم پیلانەیان دەبێت بە گورج و گۆڵی و چاو کراوەییەوە ئەم سەلامە بە زیندویی ڕابگرین و پاداشت و فەزڵ و گەورەییشی بۆ خەڵك ڕوون بکەینەوە.

## وەڵامدانەوەی سەلام لە مافەکانی ڕێگایە

بایەخدان بە ڕێگا بۆتە بابەتێکی سەردەمیانە، بەردەوام خەڵکی لێ هۆشیار دەکرێتەوە، بەلاَم بەداخەوە بێ ئەوەی ئاماژە بەو ڕێنماییە جوانانەی سەروەرمان بکرێ (ﷺ)کە ١٤٣٥ ساڵ بەر لە ئێستا باسی لە بابەتی ڕێگا کردووە، کە شایەنی ئەوەیە لەتابلۆی سەرنج ڕاکێش بنوسرێتەوەو لەشەقامو سەیرانگاکان هەڵبواسرێت لەمانە: جوان ڕاگرتنی ڕێگاکان، لادانی ئەزیەتو ئازار، هەروەها ڕێگای نەگرتنو خەڵك لێ قەدەغە نەکردن، پیسو پۆخڵ نەکردنی، بێجگە لەمانە مافی ڕێگای داناوە، وەکو لەم فەرموودەیە هاتووە، قال رسول الله (ﷺ): (إيَّاكُمْ والجُلُوسَ على الطُّرُقاتِ، فقالوا: مالَنا بُدٌّ، إنَّما هيَ مَجالِسُنا نَتَحَدَّثُ فيها، قال: فإذا أتيتم إلى المجالسَ، فأعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّها، قالوا: وما حَقُّ الطَّرِيقِ ؟ قال: غَضُّ البَصَرِ، وكَفُّ الأذى ، ورَدُّ السَّلامِ، وأمْرٌ بالمَعْرُوفِ، ونَهْيٌ عنِ المُنْكَرِ) البخاري برقم (٢٤٦٥).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: نەکەن لەسەر ڕێگاوبان دابنیشن، گوتیان: چارمان نییە، شوێنی دیکەمان نییە کە لێی دابنیشین و قسەو باسی لێ بکەین، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: جا مادام وایە، ئەگەر هاتنە مەجلیسەکانتان مافی ڕێگەوبان بدەن، گوتیان: مافی ڕێگەوبان چییە؟ فەرمووی (ﷺ): چاو دانەواندن و نەڕوانینی ئافرەتی نامەحرم، و ئازار نەدانی خەڵك، وەلآمدانەوەی سەلام، و فەرمان کردن بە چاکە، و قەدەغە کردن لە خراپەیە.

## ئادابی سەلام کردن

١- لەپێشدا سەلامکردن دواتر قسەکردن.

بۆ نواندنی شێوازێکی جوان و نەرم، بۆوەرگرتن و گوێڕاگرتنی بەرامبەرەکەت لەقسەو داواکەت ئەوا لەپێشدا سەلام بکە ئینجا بڕۆ ناو بابەتەکە.

قال رسول الله (ﷺ): (السلامُ قبلَ السُّؤالِ، فَمَنْ بَدأكُمْ بالسُّؤالِ قبلَ السلامِ فلا تُجيبوه) صحيح الجامع الصغير برقم (٣٦٩٩).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: سەلامکردن پێش پرسیارکردن، جا هەر کەسێ پێش ئەوەی سەلامتان لێ بکات بە پرسیارو قسەکردن لەگەڵتان دەستی پێکرد، ئەوا وەلآمی مەدەنەوە. وەلآمنەدانەوی ئەم جۆرە کەسانە تەنها وەکو تەمێ کردنی ئەو کەسانەیە تا بەخۆیان دابچنەوە کە وازیان لە سونەتێکی وا گەورە هێناوە.

٢- دەستپێشخەری لە سەلام کردن.

بۆ ئەوەی بۆ بەرامبەرەکەت بسەلمێنی کە ئەوت خۆش دەوێ و بەپەرۆشی گفتوگۆی لەگەڵ بکەی، بۆ دەستکەوتنی خێری زیاتر و نزیك بوونت لەخودای گەورە، ئەوا خێرا بکەو هەوڵ بدە تۆ لەپێشدا سەلام لەبەرامبەرەکەت بکەی، قال رسول الله (ﷺ): (إِنَّ أَوْلَى الناسِ بالله تعالى مَنْ بَدَأَهُم بالسَّلامِ) أبو داود برقم (٥١٩٧) صحَّحَه الالباني.

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: بەڕاستی شایەنترین و لەپێشترینی خەڵك بەڕەحمەت و بەزەیی خودای گەورە ئەو کەسەیە کە زووتر سەلام لەبەرامبەرەکەی دەکات.

بوشەیری کوڕی یەسار دەڵێ: ما كان أحدٌ يبدأُ – أو يَبْدُرُ – ابن عُمرَ بالسلامِ. البخاري في الأدب المفرد برقم (٩٨٢) وقال الألباني: صحيح الاسناد.

واتە: کەس نەبووە لە سەرەتا یان زووتر سەلامی لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کردبێت (خودا لێیان ڕازی بێت).

### ٣- سەلامکردن لەوەی دەیناسی و نایناسی

ئامانج لەسەلامکردن خەڵك ناسین و تێکەڵ بوونە بۆیە سەلام کردن لە موسڵمانان بەگشتی بەکارێکی باش دانراوە، وە سەلامکردنی تایبەتیش بەکارێکی خراپ دانراوە ، عن عبدالله بن عمرو (رضي الله عنهما) أنَّ رَجُلاً سألَ النبيَّ (ﷺ) أيُّ الإسلامِ خيرٌ؟ قالَ: (تُطعِمُ الطعامَ، وتَقْرأُ السَلامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ ومَنْ لَمْ تَعْرِفْ) البخاري برقم (١٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودا لێیان ڕازی بێ) گوتی: پیاوێك لە پێغەمبەری خودای (ﷺ) پرسی : چ کارێك لە ئایینی ئیسلامدا زۆر چاکە؟ فەرمووی (ﷺ): خواردن بدە، سەلامیش لەهەموو کەس بکە، جا چ بیناسی یان نەیناسی. سەلامکردن لەو کەسەی کە نایناسی خۆ بچوك نیشاندانە، بەگەورە ڕاگرتنی درووشمی ئیسلامە، و چاودێری کردنی برایەتی موسڵمانە، هەروەها لە دڵسۆزیەوەش نزیکە، سەلامکردنی تایبەتیش بەنیشانەی هاتنی قیامەت دانراوە وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (بينَ يَدي الساعَة : تسليمُ الخاصَّة....) الحاكم في (المستدرك) برقم (٨٣٧٨)، البخاري في (الأدب المفرد) برقم (١٠٤٩) وصححه الالباني.

واتــــه: نیشــانەکانی هــاتنی قیامـــەت ئەمانـــەن : ســـەلامکردنی تایبەت....) لەفەرمودەیەکی دیکـەدا هـاتووە: (إنَّ مِنْ أشْراطِ السَّاعةِ، إذا كانتِ التَّحيَّةُ على المَعْرِفَةِ) احمد في (مسنده) برقم (٣٦٦٤) وحسَّنه شعيب الارنؤوط.

واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: بەڕاستی لەنیشانەکانی قیامەت ئەمەیە ئەگەر هاتوو سەلام تەنها لەناسراو کرا.

بۆیــه وا ســوننەتە کــە چــویتە لای کۆمەڵــە خــەڵکێك ســەلام لــە هەموویان بکەی بێ ئەوەی تەنها ڕوو لەکەسێکی ناسراو بکەی، دواتر کارت بەکێ بوو دەتوانی زیاتر گفتــی لەگــەڵ بکــەی، یــان بــەلای دوو کــەس تێپــەڕی تــەنها ســەلام لــەوەیان نەکــەی کــە دەیناسی، چونکە بەم ڕەفتارە ناشرینە کەسـەکەی تـر بریـندار دەکەیت و دڵی لێت دەڕەنجێ، خوێندنەوەیـەکی ناتەندروسـتت بۆ دەکا، دەزانین دونیاش شەوو ڕۆژێك نییە لەوانەیە بەهۆی زۆر سەلام کردن لەخەڵك، لـەکاتی لێقـەومان خـەڵکێکی بەرچاو بۆ دڵنەوایـــەیی و هاوکاریـــت لێـــت کۆببێتـــەوە، بـــە پـــوختی: سەلامکردنی تایبەت مانای بەرژەوەندی پەرستنە، پەرتەوازییە، بێ ڕەحمیە، دوورە پەرێزییە بۆیـە پێغەمبـەر (ﷺ)بـە یـەکێك لەنیشانەکانی هاتنی قیامەتی داناوە جا پێویسـتە خۆمـانی لێ بپارێزین.

٤- سەلامکردن بە دەنگێکی ڕوون و ئاشکرا.

دووبارە کردنەوەی سەلام یان قسە بۆ کەسێك کە گوێی لێ نییە، یان تێی نەگەیشت، ئادابێکە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) بۆ ئێمەی دارشتووە، تاکو کێشەو گومانی خراپ لەنێوانماندا سەرهەڵنەدات، عَن أنسٍ (رضي الله عنه) عَن النبيَّ (ﷺ): (أنه كان إذا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أعادها ثلاثاً حتىَ تُفْهَمَ عنه، وإذا أتى على قومٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهم، سَلَّمَ عليهم ثلاثاً) البخاري برقم (٩٥).

واتە: لەئەنەسەوە (خودا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کە پێغەمبەر (ﷺ) گوتەیەکی بفەرمووبا سێ جار دووبارەی دەکردەوە هەتا بە ڕوونی لێی تێدەگەیشترا، وە کاتێکیش بهاتایە لای خەڵکێك سەلامی لێ دەکردن، سێ جار سەلامەکەی دووبارە دەکردەوە.

بێگومان دووبارە کردنەوەی قسەو سەلامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر هۆکارێك بووە نەك بەبێ هۆکار سێ جار سەلامی دووبارە کردبێتەوە، ئەگەر بەبێ هۆکار بوایە، ئەوا یاوەران وایان دەکرد.

هەروەها ئادابێکی دیکەی سەلامکردن، دەنگ هەڵبڕینە بەگوێرەی پێویست چونکە سەلامکردن دروشمی ئیسلامە، پێویستە دەربڕینەکەی گونجاوو شیاو بێ بۆ ئەو وشە بەرزو پیرۆزانە، هەروەها ڕەچاوی شوێن و کەسەکان بکرێ، نەك بە سوکایەتی و

گاڵتە پێکردنەوە دەربڕێت و ژاوە ژاو درووست بکات، بەڵکو سەلام کردنەکە دەبێ کەشێکی ئارام و هێمن درووست بکات.

عن المقداد بن الاسود(رضي الله عنه) قال: (.... فيَجيءُ من الليلِ فيُسلِّمُ تسليماً لا يُوقِظُ نائماً، ويُسْمِعُ اليَقْظانَ...) مسلم برقم (٢٠٥٥).

واتە: لەمقدادی کوڕی ئەسوەدەوە (خودا لێی رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (ﷺ) لەشەودا دەهاتە لامان سەلامێکی وای دەکرد کە نوستوەکان خەبەریان نەدەبۆوە، وە بەخەبەرەکانیش گوێیان لێ دەبوو. ئا ئەمەیە مافی مرۆڤ! چۆن گرنگی بە هەستی خەڵکێکی نوستوو داوە، بۆیە دەبێ عیبادەت لەسەر حیسابی خەڵك نەکرێ، بە واتایەکی تر نابێت خەڵکی تووشی سەغڵەتی و بێزاری بکەی.

بەڵام ئەگەر سەلامەکەت هەر وەڵامنەدرایەوە ئەوا بێگومان کەسێکی باشترو پاکتر وەڵامی سەلامەکەت دەداتەوە، نەك خەڵکێك هەیە دەڵێ: سەلامەکە سوتا، یان بەسەر خۆت دابشکێیەوە، نەخێر وانییە خێرت بۆ نوسراوەو فریشتەی لای ڕاستەش وەڵامیدایەوە، عەبدوڵلای کوڕی سامت (خودا لێیان ڕازی بێ) گوتی: بە ئەبو (ذەر)م گوت (خودا لێی ڕازی بێ) بەلای عەبدولڕەحمانی کوڕی ئومیلحەکەم داڕۆیشتم سەلامم لێی

کرد بەلاّم هیچ وەلاّمی نەدامەوە ئەبو (ذەر) گوتی: کوڕی برام (ردَّ علیكَ مَنْ هو خیرٌ منه، مَلَكٌ عن یمینه) البخاري في (الأدب المفرد) برقم (١٠٣٨). وقال الألباني: صحیح الاسناد موقوفاً على أبي ذر، وصح مرفوعاً عن غیره.

واتە: کەسێکی چاکتر لەو وەلاّمی سەلامەکەی دایەوە، ئەویش فریشتەی لای ڕاستیەتی.

لە فەرمودەیەکی تر بەمجۆرە هاتووە:(..... وإن لم یُرَدَّ علیه ردَّ علیه مَنْ هوَ خیرٌ منهُ وأطْیَبُ) البخاري في (الأدب المفرد) برقم (١٠٣٩) وقال الألباني: صحیح موقوفاً، وصح مرفوعاً.

واتە: ئەگەر سەلامەکە وەلاّم نەدرێتەوە ، ئەوا لەو چاکترو پاکتر وەلاّمی سەلامەکەی دەداتەوە.

**٥- سەلامکردن بەجولانی سەرو هەروەها تەنها بە ئاماژەی دەست و پەنجە نابێت**

سەلامکردن بەم چەند وشە پیرۆزە دەکرێ ئینجا ئەگەر دەستیشی لەگەلّ بەکاربێت کێشە نییە.

قال رسول الله (ﷺ): (لیس مِنّا مَنْ تَشَبَّهَ بِغَیْرِنا، لا تَشَبَّهَوا بالیَهُودِ وَلا بالنَّصارى، فإنَّ تَسْلیمَ الیَهُودِ الإشارةُ بالأصابعِ ،

وَتَسليمَ النَّصارى الإِشارةُ بالأَكُفِّ) الترمذي برقم (٢٦٩٥) وحسَّنه الألباني.

واتـه: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرمویـەتی: ئـەو کەسـە لەسـەر ڕێبازی ئێمە نییە کە خۆی بەغەیری ئێمە دەچوێنێت، کـەوابوو نە چاو لە جولەکە، نە چاو لە گاورەکان مەکەنەوە بشـزانن کـە سەلامی جولەکەکان ئاماژە کردنە بـە پەنجـەکان ، وە سـەلامی گاورەکانیش ئاماژە کردنە بە لەپی دەست. ئەگـەر سـەلامکردن تەنها بە ئاماژەی دەست بێ و وشەکان لەگەڵی بـەکار نەیـەت، ئەوا بەسەلامکردن حیساب نییە، وەلآمی نادرێتەوە هەتا گوێـت لە وشەی سەلامکردنەکە دەبێ. ئەمە بۆ کەسێك لێت نزیك بوو، بەلآم ئەگەر کەسەکەت دەبینی بەلآم لێـت دوور بـوو یـان کـەڕو لاڵ بوو یان لەناو ئۆتۆمبێل بوو یان لە حالـەتێکی تایبـەت بـوو ئەوا دەکرێ تەنها بەدەست ئامـاژەی بـۆ بکـەی، بـەو مەرجـەی لەبـەرە خـۆت سـەلامەکە بڵێیتـەوە، بەرامبەرەکـەش بەدەسـت ئامـاژە دەکـات و لەبـەرە خـۆی وەلآمەکـە دەداتـەوە، لـەم حاڵەتانە بەم جۆرە شیاوە نەك سـەلامەکە بـەهاوار بگەیەنرێتـە بەرامبەرەکە.

٦- زۆر سەلامكردن.

پێش ئەم خاڵە زۆر باسی بڵاوكردنـەوەی سـەلاممان كـردووە، كـە پێغەمبەر (ﷺ) هانی داوین، ئەوەی دەمەوێ لەم خاڵـە باسـی بكەم ئەوەیە ، خەڵكێك گەر یەك جار یەكتر ببینێت پاشان لێـی دابڕێ، دواتر بەیـەك بگەنـەوە سـەلام ناكاتـەوە، پێـی شـەرمە دەڵی تازە لەلات بووم، یان هەیە سەلام دەكاتەوە خەڵكێك پێی بێـزار دەبـن وا دەزانـن گـومرگی لەسـەرە یـان زیـانی هـەبێ یـان......). بزانـە پێغەمبـەر (ﷺ)چـۆن باسـی دووبـارە سەلامكردنەوەی كردووە:

عن أبي هريرة (رضي الله عنه) عن رسول الله (ﷺ)قـالَ: (إذا لقـيَ احَدُكم أخاه فَلْيُسَلّمْ عليه، فإنْ حالتْ بينهما شجرةٌ أو جدارٌ أو حجرٌ ثم لقيَهُ فَلْيُسَلّمْ عليه أيضاً) أبـو داود بـرقم (٥٢٠٠) قـال الالباني: صحيح موقوفاً و مرفوعاً.

واتـە: لەئـەبو هـورەیرەوە (خـودا لێـی ڕازی بـێ) لـە پێغەمبـەری خوداوە (ﷺ) فەرمویەتی: كاتێ یەكێكتان بە براكـەی دەگـات با سـەلامی لێبكـات جـا ئەگـەر درەختێـك كەوتـە نێوانیـان یـان دیوارێك یان بەردێكی (گەورە) دواتر پێـی گەیشـتەوە، ئـەوا بـا دیسان سەلامی لێبكات.

کەوابوو سوننەتە لەهاتوچۆکردنا سەلام دووبارە بکرێتەوە. نمونە: کەسێك میوانی دێت، لەکاتی هەر هات و چۆکردنێك جا بۆ هەر شتێك دەربچێت دواتر بگەڕێتەوە لای میوانەکانی سوننەتە سەلامیان لێ بکاتەوە.

**٧- سوار سەلام لە پیادە و پیادەش سەلام لە دانیشتوو، ژمارەی کەم سەلام لە ژمارەی زۆر، بچوك سەلام لەگەورە دەکات**

قال رسول الله (ﷺ): (يُسَلِّمُ الراكبُ على الماشي، والماشي على القاعد، والقليلُ على الكثير، ويُسَلِّمُ الصغيرُ على الكبير) الترمذي برقم (٢٧٠٣) وصححه الالباني.

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: ئەوەی بە سواری دەڕوات سەلام لە پیادە دەکات، بە پیادە سەلام لە دانیشتوو دەکات، و کەم سەلام لە زۆر دەکات، و بچوك سەلام لە گەورە دەکات.

دەکرێ بۆ نیاز پاکی و خێری زیاتر لەم یاسایە دەربچیت و بە پیادە سەلام لە سوار بکات جا بەم شێوەیە.... بەتایبەتی کەسی بەتەمەن سەلام لەخۆی بچوکتر بکات، ئەمەش وەکو فێرکردن، خۆ بچووك نیشاندان، حیساب کردنێك بۆ بچوکەکە وەکو ئەوەی بڵێی تۆ هەی بۆ ئەوەی دواتر گوێڕایەڵیت بکات،

فێـری داب و نـەریتی کۆمەڵایـەتیش بێـت، بۆیـە پێغەمبـەر (ﷺ)سەلامی لە منداڵان کردووە.

عَن ثابت البُنانيٍّ عن أنس بن مالك (رضي الله عنه) أنه مَـرَّ علـى صِبيانٍ فَسَلَّمَ عليهم ، وقال: كان النبي (ﷺ) يَفعَلُهُ. البخاري برقم (٦٢٤٧).

واتە: لەسابتی بونانیەوە دەڵێ : ئەنەسی کوڕی مالـك (خـودا لێـی ڕازی بـێ) بـەلای منداڵـندا تێپـەڕ بـووەو سـەلامی لێکـردوون و گوتی: پێغەمبەر (ﷺ)سەلامی لێ دەکردن.

## ٨- سەلام کردن لە کەس و کار لەکاتی هاتنەوە بۆ ماڵەوە.

ئیسلام دینێکە شەریعەتەکەی وا دارشتووە کە لەگـەڵ پلـەو ڕێـزی مرۆڤەکان بوەشێتەوە، لەمانەش کە دەچیتە ماڵەوە بـە وشـەی سەلام و ڕەحمەت و بەرەکات لەگەڵ خانەوادەکەت دەسـت پـێ بکەیت ، نەك بە هات و هاوارو وشەی ناشرین و ناڕێـك، یـان بـە نهێنی و لەپڕ خۆت بکەیتە نێو ماڵ، پێغەمبەر (ﷺ)بەئەنەسی فەرموو: (يا بُنَيَّ ! إذا دَخَلْتَ عَلى أهْلِكَ فَسَلِّمْ، يكونُ بَرَكَةً عليكَ وَعَلى أهْلِ بَيتِك) الترمذي برقم (٢٦٩٨) ذكره الالباني في كتابه (صحيح الاذكار) برقم (٢٢٧).

واتە: ڕۆڵەکەم! کاتێ چوویتە ماڵەوە سەلامیان لێ بکە، ئەو سەلام کردنەت دەبێتە مایەی بەرەکەت بەسەر خۆت و خانەوادەکەت.

لە ژیانی دونیا گەر هەموو ئامادەکارییەك بکەی بۆ سەرکەوتن و هەموو شتێك فەراهەم بکەی بۆ گەیشتن بەهیواکان، پارەو پولی زۆرت لەلابێ بەلاّم بەرەکەتی خودای گەورەی لەگەلّ نەبێ، ئەوا مایە پوچ دەبێ، جا بۆ بەدەست هێنانی ئەم بەرەکەتەش کاتێ گەڕایتەوە مالّەوە سەلامیان لێ بکە، جگە لەم فەزلّە خودای گەورە زامنی ئەو کەسانە دەکات وەکو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ثلاثةٌ كلُّهُمْ ضامِنٌ على الله، إنْ عاشَ رُزِقَ و كُفِيَ، وإنْ ماتَ أدخَلَه الله الجَنَّةَ : مَنْ دَخَلَ بَيْتَه فَسَلَّمَ، فهو ضامِنٌ على الله) أبو داود برقم (٢٤٩٤)، ابن حبان في (صحيحه) برقم (٤٩٩) اللفظ لـه، البخاري في (الادب المفرد) برقم (١٠٩٤) وصححه الالباني.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: سێ چین هەن خودای گەورە چاودێری و پارێزگاری کردنی هەموویانی خستۆتە سەر خۆی جا ئەگەر ئەو کەسە (ئەو ڕۆژە) بژیت ڕۆزی لەسەر فراوان دەکات و لەشەڕو ئاژاوە دەیپارێزێت، ئەگەر مردیش ئەوا خودای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە.

یەکەمیان: کەسێ بچێتە مالّەوە سەلام لەکەس و کارەکەی بکات، ئەوا ئەو کەسە لەسەر خودای گەورە زامنە.

جا لەم ڕێگایە ئاسانتر هەیە تا بتوانین پارێزگاری خودای گەورە بۆخۆمان مسۆگەر بکەین؟! سا پێویستە سەلام کردن لەکەس و کارمان لەبیر نەکەینو بۆی بەپەرۆش بین.

**٩- سەلام کردن لەکاتی چوونە نێو ماڵێکی چۆڵ.**

قالَ عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما): **(إذا دَخَلَ البيتَ غير المسكونِ، فَلْيَقُلْ: السلام علينا، وعلى عبادِ الله الصَّالحين)** مالك في (الموطأ) برقم (١٧٥٢)، البخاري في (الأدب المفرد) برقم (١٠٥٥) وقال الالباني: حسن الاسناد.

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودا لێیان ڕازی بێ) فەرمویەتی: ئەگەر کەسێك چووە نێو ماڵێکی چۆل با بڵێت: سەلام لەسەر ئێمەو لەسەر بەندە چاکەکانی خودا.

**١٠- سەلام کردن ئینجا مۆڵەت وەرگرتن:**

ئەدەب وایە بەر لە مۆڵەت وەرگرتن سەلام بکرێ، چونکە سەلام کردن کلیلی مۆڵەت خواستنە کە بەبێ سەلام کردن مۆڵەت خواستنەکە ناتەواوە، عن عطاء عن أبي هريرة (رضي الله عنه) فِيمَنْ يَستَأذِنُ قَبلَ أن يُسَلِّمَ قال: **(لا يُؤْذَنُ له حتَّى يَبْدَأَ بالسَّلامِ)** البخاري في (الادب المفرد) برقم (١٠٦٦) وقال الالباني: صحيح الاسناد.

واتە: لە عەتاوە لەئەبو هورەیرەوە (خودا لێی ڕازی بێ) پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەو کەسەی بەر لە سەلام کردن مۆڵەت وەردەگرێت بۆ هاتنە ژوورەوە، کە ئایا ڕێگای پێبدرێ یان نا؟ فەرمووی: نەخێر ڕێگای پێنادرێ بێتە ژوورەوە هەتا مۆڵەتەکە بەسەلام کردن دەست پێدەکات.

١١- گەیاندنی سەلام و وەڵامدانەوەی سەلامەکە.

پێویستە ئەو کەسەی سەلامی پێ ڕەوانە دەکرێ، فەرامۆشی نەکات، بیگەیەنێتە کەسی مەبەست بڵێ: فلانە کەس سەلامت لێ دەکات، ئەویش واجبە وەڵامی سەلامەکە بداتەوە، هەروەها وا باشە سەلام لە پەیامنێرەکەشی بکات و بڵێت: وعليه (ها) و (عليك) السلام ورحمة الله وبركاته.

قال ابو سلمة:إنَّ عائشة (رضي الله عنها) قالتْ: قال رسول الله (ﷺ)يوماً:(يا عائِشَ هذا جبريلُ يُقْرِئُك عليك السلامَ، فَقُلتُ: وعليه السلام ورحمة الله وبركاته، ترى ما لا أرى تريدُ بذلك رسول الله (ﷺ)) البخاري برقم (٣٧٦٨) ومسلم برقم (٢٤٤٧).

واتە: ئەبو سەلەمە گوتی : عائشە (خودا لێی ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) ڕۆژێك فەرمووی: عائیش (کورتکردنەوەی ناوی عائیشە) یە بۆ خۆشەویستی دەربڕینە، ئەوە جبریلە سەلامت لێ دەکات، منیش گوتم: و عليه السلام

ورحمة الله وبركاتـه، ئـەوەی پێغەمبـەر (ﷺ) دەیبینـێ مـن نابینم.لەفەرموودەیـەکی دیکـە هـاتووە پێغەمبـەر (ﷺ) وەڵامی پەیامبەری سەلامەکە بەمجۆرە داوەتەوە: (علیك وعلی أبیك السلام) ابو داود برقم (٥٢٣١) حسنه الالباني.

واتە: سەلام لەسەرتۆو لەسەر باوکت بێت.

١٢- دەستپێکردنی نامە بە سەلامکردن.

وا درووستە نامەکانمان بەسەلامکردن دەستپێبکەین، و ئەوەی کە دەیخوێنێتەوە پێویستە یەکسەر لەبەرەخۆی وەڵامی سەلامەکە بداتەوە، بەڵگەش لەم بارەیەوە زۆرە، لەمانە عەبدوڵلای کوڕی عومـەر (خـودا لێیـان ڕازی بـێ) نامەیـەکی بەیعەتـدانی بـۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان ناردو نووسی : (بسـم الله الـرحمن الرحيم لعبد الملك أمير المؤمنين من عبدالله بن عمر: سلامٌ عليك) البخاري في (الادب المفرد) برقم (١١١٩) وقال الالباني: صحيح الاسناد.

١٣- سەلام کردن لەکاتی جێهێشتنی مەجلیسێك یان کەسێك.

ئەگەر چویتە لای کەسێك یان مەجلیسێك ئـەوا سـەلام بکـە کـاتێ ویسـتت بـڕۆی ئـەوا دووبـارە سـەلام بکـەوە چـونکە ئەمـە فەرمایشتی خۆشەویستمانە(ﷺ)، قال رسـول الله (ﷺ): (إذا انتهى أحَدُكُمْ إلى المَجْلِسِ فَلْيُسَلِّمْ، فإذا أرادَ أنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ،

فَلَيْستِ الأولى بأحقَّ من الأخرة) أبو داود برقم (٥٢٠٨) الترمذي برقم (٢٧٠٦) وقال: الالباني حسن صحيح.

واته: پێغەمبەری خودا (ﷺ)فەرمویەتی: ئەگەر یەكێ لەئێوە دەگاتە مەجلیسێك با سەلام بكات، جا ئەگەر ویستی بڕوات با دیسان سەلام بكاتەوە، چونكە سەلامی یەكەم لە سەلامی دووەم باشترو شایستەتر نییە.

كەسێك كە دەگاتە لای خەڵكێك بەسەلام كردنەكەی پێیان ڕادەگەیەنێ كە ئێوە سەلامەت دەبن لەشەڕو ئاشوبی من ، كە دەڕواتن دووبارە سەلام دەكاتەوە پێیان ڕادەگەیەنێ كە لەدوای ئێوە نابمە مایەی شەڕو خراپەكاری و قسە بردنی نێو دانیشتنەكان و غەیبەتكردنتان ...) كەوابوو سەلامی دووەم هیچی كەمتر نییە لە سەلامی یەكەم، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ)كردویەتیە سوننەت بۆ ئوممەتەكەی.

## سەلامكردنی پیاوو ئافرەت لەیەكتری

پێغەمبەر (ﷺ)سەلامی لە ئافرەتان كردووە، هەروەها ئافرەتانیش سەلامیان لێ كردووە، عن شَهْر بن حوشب يقول: أخْبَرَتْه أسماءَ بنت يزيد:(مَرَّ علينا النبيُّ (ﷺ)في نسوةٍ فَسَلَّمَ

علينا) أبو داود برقم (٥٢٠٤) ابن ماجه برقم (٣٧٠١) صححه الالباني.

واته: له شەهری کوڕی حەوشەبەوە گوتی: ئەسمای کچی یەزید پێی وتم: کە پێغەمبەر (ﷺ)بەلای ئێمەدا تێپەڕ بووە کە کۆمەڵە ئافرەتێك بووین سەلامی لێ کردووین. هەروەها ئافرەتیش سەلامی لەپێغەمبەر کردووە (ﷺ)وەکو ئوممو هانی دەڵێ: ....... سەلامم لە پێغەمبەر (ﷺ)کردووە. البخاري برقم (٣١٧١).

کەواتە: سەلام کردنی پیاو لە ئافرەتان و بەپێچەوانەشەوە کارێکی دروستو رێگە پێدراوە بەڵام بەو مەرجەی ئەو کەسە متمانەو بڕوای تەواوی بەخۆی هەبێت کە تووشی هیچ شتێکی خراپ نابێ ، نابێتە هۆی کردنەوەی دەرگای فیتنەو گومانی خراپ.

## سەلام کردن لە مرۆڤی گوناهکاری ئارەزوو پەرست

دەکرێ سەلام لەو کەسە نەکرێ کە بە ئاشکرا گوناه دەکات و زیادە ڕەوی کردووەو لە سنوور دەرچووە، وەکو تەمێ کردنی و بەخۆ داچونەوەی، بەئومێدی ئەوەی ببێتە هۆکاری گەڕانەوەی و

وازهێنـانی لـەم گوناهــە، بـەڵام ئەگـەر دەبـوە هۆکـاری زیـاتر گونـاهکردنی و ڕۆچـونی لـەم خراپەیـە ، دوور کەوتنـەوەی لـە موسـڵمانانی چـاکە خـواز ، ئـەوا سـەلامی لێ بکـرێ باشـترە، تـا ئامۆژگاریـەکان وەربگـرێ ، کـەوابوو سـەلامکردن و نـەکردن لێـی دەبێ ڕەچاوی چارەسەری گوناهەکـەی بکـەی کامیـان بـە چـاکتر بزانی کار بەوە بکەیت ، لە ریوایەتێك هاتووە: (أنَّ رجلاً أتى النبيَّ (ﷺ)وفي يَدِهِ خاتمٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَأعْرَضَ النبيُّ (ﷺ) عنه، فَلَما رأى الرَّجُلُ كراهيَتَهُ ذهبَ فألقى الخاتَمَ، وأخَذَ خاتَماً مِن حديدٍ فَلَبِسَهُ، وأتى النبيَّ (ﷺ)قال: هذا شَرٌّ، هذا حِلْيَةُ أهلِ النارِ ، فَرَجَعَ فَطَرَحَهُ ولَبِسَ خاتِماً مِن وَرِقٍ، فَسَكَتَ عنه النبيُّ (ﷺ)) احمد في (مسنده) برقم (٦٥١٨)، البخاري في (الادب المفرد) بـرقم (١٠٢١) وحسَّنه الالباني.

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)ئەنگوستیلەیەکی زێـڕی لە پەنجە خستبوو ، پێغەمبەر (ﷺ)پشتی لێ کرد، کاتێ پیاوەکە زانی پێغەمبەر (ﷺ)ئەمەی پێ ناخۆشە، چوو ئەنگوسـتیلەکەی فڕێدا ، ئەنگوستیلەیەکی ئاسنی هێناو لە پەنجەی خست، هاتـەوە لای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی : ئـەوە خراپـە ، ئـەوە (خشـڵ) یـان (سـیفەتی) خـەڵکی دۆزەخـە، پیاوەکـەش گەڕایـــەوەو بەهـــەمان شـــێوە ئەویشـــی فڕێـــدا ، ئـــەمجارە

ئەنگوستیلەیەکی زیوی لە پەنجە خست ، هاتەوە لای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەمجارە پێغەمبەر (ﷺ) لە بارەیەوە بێدەنگ بوو.

چەندەها بەڵگەی تری ڕاست و دروست هەن کە باس لە خۆتێنەگەیاندن و سەلام نەکردنی کردووە لەبەرامبەر کەسانی خراپەکاری بە ئاشکرا تاکو وەکو دەرمان بۆ دەردەکەیان بەکار بهێنرێ، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە شکاوە ئەوا بۆ بەرژەوەندی دینەکەی سەلامی لێی بکرێ باشترە.

## دەستپێشخەری نەکردنی سەلام لە کافرو گاورو جولەکەو ئەهلی (ذمە)

موسڵمان دەبێ لەکاتی مامەڵە کردن و ڕەفتار کردن لەگەڵ خەڵکی بێ دین چاکە خواز بێ و نابێ مافیان بخوات و رەفتاری ناشرین دەرهەقیان بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام یاساو ڕێسای خۆی هەیە کە نابێ لێی لابدرێ ، وەکو سەلام نەکردن لێیان، مانای ئەوە ناگەیەنێ کە لەگەڵیان خراپ و توند بن، قال رسول الله (ﷺ): (لا تَبْدَءُوا اليهودَ وَلا النصارى بالسَّلامِ، فإذا لَقِيتُمْ أحَدَهُم في طريقٍ فاضْطَرُّوه إلى أضْيَقِهِ) مسلم برقم (٢١٦٧).

واتـە: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرمویـەتی: ئێـوە لـە پێشـدا سەلام لە جولەکەو گاور مەکەن، جا ئەگەر لە ڕێگایەکیش تووشـی یەکێکیان بوون و ڕێگەکە تەنگەبەر بوو ، ئـەوا ناچـاری بکـەن کـە بکەوێتە تەنگەبەریەکەوە.

ئەوەی لەم فەرموودەیەدا تێدەگەین ئەوەیە کە نابـێ لەسـەرەتادا سـەلام لـەگاور و جولەکـەکان بکـرێ، هـەروەها ئـەوان جێگـای متمانەو بەڵێن نینە، بۆیە لەوانەیە لە پڕێك زەفەر بە موسـڵمانان ببەن، جا بۆ خۆپاراستن لێیان دەرفەتیان پێ مـەدەن و بیانخەنـە لای ڕێگا تەنگەکە، نەك مەبەست لێی ئەزیەتیان بدەن‌و بەدیواریان دابدەن، چونکە ڕێگری کراوە کە موسـڵمان بـەبێ هۆکـارێکی ڕەوا ئازاری هیچ کەسێك بدات جا لەسەر هەر ئاینێك بێ.

ئەگەر کەسێکت بینی نەتزانی موسڵمانە یان کـافرە، یـان چـوویتە مەجلیسێك کافرو موسڵمانی تیادا بوو ئەوا بە نییەتی موسڵمانەکە سەلام بکە.

ئەگـەر سەلامیشـیان کـرد ئـەوا وەڵامەکـەیان هـەر ئەوەندەیـە: (وعلیکم) مسلم برقم (٢١٦٣).

هەندێك لەزانایان (ڕەحمەتی خودایان لێ بێت) فەرموویانە: دەکرێ لەبـەر پێویسـتی‌و خـۆ بـەدوورگرتن لەشـەڕی جولەکـەو دیانـەکان

لەسەرەتادا چاكو چۆنیان لەگەڵدا بكریٚ، هەروەها ئەگەر ئەوانیش چاكو چۆنیان كرد دەكریٚ بە وشەیەكی گونجاو وەلاٚمیان بدریٚتەوە.

## تەوقە كردن

تەوقە كردن بریتیە: لە لكاندنی ناو دەست بە ناودەستی بەرامبەرەكەی تەنها بەدەستی ڕاستە نەك بە هەردوو دەست، هیچ زیكریٚكی سەحیحی تایبەتیش لە سوننەتەوە نەهاتووە تا لەگەڵی بگوتریٚ. تەوقەكردن سەلام كردنەكە تەواوو ڕازاوەتر دەكات، وەكو بەڕائی كوڕی عازەب (خودا لیٚی ڕازی بیٚ) فەرمویەتی: (مِنْ تمامِ التَّحِيَّةِ أنْ تُصَافِحَ أخاكَ) البخاري في (الأدب المفرد) برقم (٩٦٨) وصححه الالباني.

واتە: لەسەلام كردنی تەواو تەوقە كردنتە لەگەڵ براكەت. تەوقە كردن سەلامەكە بەرهەمدارتر دەكات بەوەی خۆشەویستی زیاتر دەكات ، ژەنگی حەسوودی ناهیٚلیٚت، ناحەزی ڕەش دەكاتەوە ، جگە لەمانە دەبیٚتە مایەی هەڵوەرینی گوناه.

قال رسول الله (ﷺ): (إنَّ المؤمِنَ إذا لَقِيَ المؤمِنَ فَسَلَّمَ عليهِ، وأخَذَ بيَدِهِ فصافَحَهُ، تَناثَرَتْ خطاياهما كما يتناثرُ ورَقُ الشَّجرِ)

الطبراني في (الاوسط) برقم (٢٤٥) وصحَّحَه الالباني في كتاب (الترغيب والترهيب) برقم (٣٩٣٩).

واتە: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمویەتی: بەڕاستی باوەڕدار کاتێ بە باوەڕدارێك دەگات ، سەلامی لێدەکات، دەستی گرت و تەوقەی لەگەڵ کرد، ئەوا گوناهەکانیان هەڵدەوەرێت، وەکو چۆن گەڵای دار هەڵدەوەرێت.

لە فەرمودەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی:(ما مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصافَحانِ إلاَّ غُفِرَ لَهُما قَبْلَ أن يَتَفَرَّقا) الترمذي برقم (٢٧٢٧) ابن ماجه برقم (٣٧٠٣) وصححه الالباني.

واتە: هەر دوو موسڵمانێك كە بەيەكتری دەگەن ، تەوقە لەگەڵ يەكتری دەكەن ئيللا پێش ئەوەی لەيەكتری جيا ببنەوە خودای گەورە لە گوناهی هەردووكيان خۆش دەبێت.

عن أنسٍ بن مالك (رضي الله عنه) قالَ: قال رجلٌ: (يا رسول الله (ﷺ) الرَّجُلُ مِنَّا يَلْقي أخاه أو صَديقَه أيَنْحَنِي لَه؟ قال: لا ، قال: أفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ؟ قال: لا، قال: أفَيأخُذُ بِيَدهِ ويُصافِحُهُ؟ قال: نَعَمْ) الترمذي برقم (٢٧٢٨) وابن ماجه برقم (٣٧٠٢) وحسنه الالباني.

واتە: لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (خودا لێی ڕازی بێ) گوتی: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ)كاتێ پیاوێك لە ئێمە

بە براکەی خۆی یان بە دۆستێکی خۆی دەگات ئایا بۆی بچەمێتەوە؟ فەرموی (ﷺ): نەخێر، گوتی: ئەی لەباوەشی بگرێت‌و ماچی بکات؟ فەرمووی (ﷺ): نەخێر، گوتی: دەستی بگرێت و تەوقەی لەگەڵ بکات؟ فەرمووی: (ﷺ)بەڵێ.

لەم فەرمودەیە ئەوە بەدیار دەکەوێت کە خۆچەماندنەوە بۆ غەیری خودا بەهەر نییەتێك بێ دروست نییە، تەنها زۆری لێ بکرێت، بەڵام تەوقە کردن سوننەتێکی تەئکید کراوی پێغەمبەرە (ﷺ) هەموو کات دەکرێ، کەچی ماچ کردنە لەبەر هۆکاری داب‌و نەریت، یا سۆزو رەحم پێ هاتنەوە، یان هۆکاری لێك دابڕان‌و گەڕانەوە لەسەفەر دەکرێ لەبەر ئەم فەرموودەیە کە ئەنەس (خودا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: **(كان أصحابُ النبيِّ (ﷺ)إذا تلاقَوا تصافَحوا وإذا قَدِموا من سَفَرٍ تعانَقوا) الطبراني في (الاوسط) برقم (٩٧) وصحَّحَه الالباني في كتاب (الترغيب والترهيب) برقم (٣٩٣٨).**

واتە: ئەنەس (خودا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: جاران یاوەرانی پێغەمبەر (ﷺ) کە بەیەکتری گەیشتبان تەوقەیان دەکرد، ئەگەر لەسەفەر گەڕابانەوە یەکتریان ماچ دەکرد. سەرەڕای دروست بوونی بەڵام ئەگەر ماچ کردنەکە دەرگای ئارەزوو بازی‌و زیادە رەوی کردەوە ئەوا واز هێنانی پێویستە.

# سەلام نەكردن لەهەندێ كاتدا

سـەلام كـردن لەهەنـدێك كاتـدا نـەكرێت باشـە وەكـو لـەكاتی سـەرقاڵبوون بـەزیكرو قورئـان خوێنـدنو بـانگو قامـەت، نوێـژ كردن.....، بـەڵام لـەكاتی سـەرئاوو وتـاردانی ڕۆژی هـەینی تـەرك كردنـی پێویسـتە، ئەگـەر سـەلامیش بكـرێ وەڵامـی سـەلامەكە نادرێتەوە.

## لەکۆتاییدا

پاش ئەوەی زانیمان کە سەلامکردن چەندە خێرو پاداشتێکی هەیەو چەندە کاریگەری سوودی لەبوارەکانی ژیاندا هەیە، بۆیە پێویستە بە هیمەتێکی بەرزو گورپوتینێکی بەهێزو بەبێ شەرم کردن و بە شانازییەوە ئەم سوننەتە فەرمان پێکراوە بە زیندوییەوە ڕابگرین و نەهێڵین وشەی تر جێگای ئەم دروشمە بەرزو پیرۆزە بگرێتەوە.

٩ / رمضان/ ١٤٢٤

١١.٣٠ نیوەڕۆ.

# ناوەڕۆك

*** سەلام كردن :**

- جێبەجێكردنی فەرمایشتی خوداو پێغەمبەرە (صلى الله عليه وآله وسلم).
- جێ بەجێ كردنی ئەرك و مافی موسڵمانانە بەسەر یەكتریەوە.
- ناونیشانی سەلامەتی و خوو رەوشت بەرزییە.
- چارەسەری نەخۆشییە دەروونییەكانە.

*** كارێكی ئاسانەو پاداشتی گەورەی هەیە لەمانە :**

- كامل بوونی باوەڕ.
- كۆكردنەوەی پاداشتی زۆر.
- رواندنی خۆشەویستی.
- یەكتر ناسین.
- نەهێشتنی ساردی و دووبەرەكی نێوان خەڵك.
- سەلامەت بوون.
- بەرز بوونەوەی پلەو پایە.
- یەكریزی و تەبایی.
- چوونە بەهەشت.
- دەستەبەری كۆشك و تەلاری بەرز لە بەهەشت.
- پارێزراوبوون لەسیفەتی رەزیلی.
- تاواندنەوەی رق و كینە.
- راكێشانی دڵی بەرامبەر.